# ئینگلیزیی تایبەتمەند بۆ قوتابیانی رۆژنامەگەری و گەیاندن




وەرگێڕانی

ئاوارە حاجی خدر



**پێشکەشە بە...**

**ـ پرۆفیسۆر دکتۆر تاهیر حسۆ زێباری**

**ـ مامۆستایانی بەشی راگەیاندن لە کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی سەڵاحەددین**

**ـ خاوەن قەڵەمە بوێرەکانی بواری میدیا**

**ـ دایکی ئازیزم**

**ـ هاوسەری ژیان و جگەر گۆشەکانم (هێما و هەیام و ئاگا)**

*******

**سوپاس و پێزانین...**

**بۆ بەڕێزان د. هیوا حاجی و مامۆستا داود رێواس**

د.سەید وەحید عەقیلی ـ د.ئەحمەد تەوەکولی

# ئینگلیزیی تایبەتمەند بۆ قوتابیانی ڕۆژنامەگەری و گەیاندن

وەرگێڕانی

**ئاوارە حاجی خدر (دێلۆیی)**




٢٠١٤



**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **ئینگلیزیی تایبەتمەند بۆ قوتابیانی ڕۆژنامەگەری و گەیاندن**
- **د. سەید وەحید عەقیلی ـ د. ئەحمەد تەوەکولی**
- **وەرگێڕانی: ئاوارە حاجی خدر**
- **پێداچوونەوەی ئینگلیزی:عەلی عەبدوڵڵا ڕەحمان**
- **هەڵەچنی ڕێنووس: ئەبوبەکر ساڵح ئیسماعیل**
- **نەخشەسازی ناوەوە: ڕێدار جەعفەر**
- **بەرگ: ڕێمان**
- **نرخ:** ٣٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم:** ٢٠١٤
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانەی: موکریانی (هەولێر)**

- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٥٧٢) ساڵی (٢٠١٤)ی پێ دراوە.**



**زنجیرەی کتێب (٨٥٦)**

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

## پێشەکی

خوێنەری بەرێز ئەم کتێبەی لە بەردەستتدایە و وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی لە نووسینی ﴿د. سەید وەحیدی عەقیلی و د. ئەحمەد تەوەکولی ﴾یە و بە ناوی ﴿ئینگلیزی تایبەتمەند بۆ قوتابیانی رۆژنامەگەری و گەیاندن﴾ کە بە زمانی فارسی و ئینگلیزی نوسراوە. بەندەش لە بەر گرنگیی بابەتەکە و کەمیی سەرچاوە لە بواری میدیا بە پێویستم زانی ئەرکی وەرگێڕانی ئەم کتێبە لە زمانی فارسیەوە بۆ زمانی کوردی بگرمە ئەستۆ، لە لایەکی دیکەوە بیرۆکەی وەرگێڕانەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە دوای ئەوەی لە لایەن یەکێك لە مامۆستایانی زانکۆوە، ئەو پەرتووکەمان وەك پرۆگرامێکی خوێندن بۆ دیاریکرا و منیش بەو پێیەی قوتابی زانکۆم و درکم بەوە کرد کە وەرگێڕانی ئەم کتێبە سوودێك بە قوتابیانی بواری میدیا و زانستی گەیاندن دەگەیەنێت و بواری میدیا لە کتێبخانەی کوردیدا دەوڵەمەندتر دەکات، ئەو ئەرکەم بەجێ هێنا. هاوکات لە وەرگێرانی ئەم کتێبە ئاستەنگی زۆرم هاتنە پێش، بە تایبەت هەندێ زاراوەی میدیایی کە لە زانکۆکانی ئێران سوودیان لێ وەردەگیرێت، لە زانکۆکانی کوردستان زاراوەی تر بەکار دەهێنرێت، بەڵام بە راوێژکردن لەگەڵ مامۆستایانی زانکۆی تاران و چەند مامۆستایەکی زانکۆی سەلاحەددین، هەوڵی ئەوەم دا کە زاراوەیەکی گونجاو دەستنیشان بکەین کە روون و ئاشکرا بێت و لە لایەنی ئەکادیمی دوور نەکەوێتەوە. ئەوەی بە لامەوە زۆر گرنگە ئاماژەی پێبدەم ئەوەیە کە نووسەرانی

ئەم کتێبە لە بەرانبەر هەر چەمکێکی ناو کتێبەکە دیدو بۆچونیان نووسیوە کە لە بابەتەکەوە نزیکە، بەڵام ناکرێت وەك مانای هەر بابەتێك کە بە فارسی نووسراوە، لێك بدرێتەوە، بەڵکو دەکرێت وەك ڕێنوێنی و بەرچاو روونییەك بۆ هەر بابەتێك سوودی لێوەربگیرێت. هەروەها بۆ سوود گەیاندن بە خوێنەرانی ئەم کتێبە، وشە گرنگەکانی هەر بابەتێکم بە زمانی کوردی نووسیوەتەوە، بۆ ئەوەی لە کاتی خوێندنەوەی هەر دەقێکی ئینگلیزی واتای هەر وشەیەکی ئینگلیزی نەزانرا، سودی لێ وەربگیرێت و کارئاسانی بۆخوێنەر بکات. هەروەها لەم وەرگێرانەدا، لە هەر بابەتێك چەند پرسیارێك بە زمانی ئینگلیزی نووسراوە کە گوزارشت لە گرنگیی ئەو بابەتە دەکات و وەك کاکڵەی بابەتەکە سەیر دەکرێت، بەڵام لە کتێبەکەدا بێ وەڵام ماوەتەوە، بۆیە بە پێویستم زانی کە وەڵامی هەر پرسیارێك بە کورتی بدەمەوە بۆ ئەوەی خزمەتێکی باشتر بە قوتابیانی بەشی میدیا و میدیاکاران بکەم. هەروەها دەمەوێت ئاماژە بەوە بکەم کە وشەی (پاڵەوانی چاوپێکەوتن) کە لەم وەرگێڕانەدا بەکارم هێناوە سوودم لە کتێبێکی پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.مەغدید سەپان بە ناوی (ژانرەکانی رۆژنامەوانی و مێژووی چاپخانە١٤٥٠ ــ١٥٠٠ ) وەرگرتووە، کە بەوشەیەکی شیاوم زانیوە بۆ ئەوەی گوزارشتی تەواو لەو کەسە بکەم کە چاو پێکەوتنی لەگەڵ ئەنجام دەدرێت. دڵنیام کە کاری وەرگێڕان و نووسین بێ کەموکوڕیی نییەو ئەم کارەی منیش لە کەموکوڕیی بەدەر نییە، بەڵام هێڤیدارم کە وەرگێڕانی ئەم کتێبە هاندەر بێت بۆ کاری باشترم لە بواری میدیادا لە ئایندەدا.

**وەرگێر**

**٢٠١٣/٨/٢٥**

# بابەتی یەکەم

## میدیا چییە؟

هەموو ئامرازگەلی پەیوەندییە گشتیەکان، کە لە رادیۆ، تەلەفزیۆن، سینەما، بڵاوکراوە چاپەمەنیەکان، ئینتەرنێت پێك دێت، پێی دەگوترێت میدیا. راگەیاندن بابەتگەلێکی بێشومار بۆ خەڵکێکی زۆر بڵاو دەکاتەوە. خەڵك بە تامەزرۆییەوە لەبەرەبەیانی هەر رۆژێکی نوێدا تا درەنگانی شەو ئارەزوی ئەوە دەکەن بزانن چی لە دەوروبەریان رووی داوە، یان بڕیارە کە روو بدات. میدیا ئەوەی نمایشی دەکات لە لای خەڵکێکی زۆرەوە بە راستی و باوەڕ لە قەڵەم دەدرێت. میدیا کاریگەریی گەورەی لە سەر بە کۆمەڵایەتی بوون و گەشەسەندن و بیروباوەڕ و بەهاکان و زانیاری هەیە. میدیا دەتوانێت رۆڵێکی ئەرێنیی یاخود نەرێنیی یاخود هەر دوو لایەنی بە یەکەوە و لە یەك کاتدا بە سەر وەرگر جێبەجێ بکات. ئێمە رۆژانە دەکەوینە بەر بڕێکی زۆری زانیاری و پەیامەکانی میدیا، بە بێ ئەوەی ئاگادار بین، دەکەوینە ژێر کاریگەرییەکانی پەیامەکانی میدیا، لەبەر ئەوەی لە زۆرێك، لە راستیەکانی پشت پەردەی هەواڵ بێ ئاگاین. بێگومان ئەگەر ئێمە لەبارەی میدیا و بەهێزیی و رێژەی کاریگەرییەکەی بخوێنینەوە ئەو کاتە لە کاریگەری بێسنووری زۆر سەرسام دەبین.

# بابەتی دووەم

## رۆژنامەکان

ئێمە بە هۆکاری جیاواز، وەك بەئاگابوون لە هەواڵ و بە دەست هێنانی زانیاری و زانینی ئەوەی کە لە جیهان و دەوروبەرمان رودەدات یان ئەوەی کە لە حاڵەتی روودانە، یاخود بۆ مەبەستی کات بەسەربردن، روو لە خوێندنەوەی رۆژنامەکان و هەفتەنامەکان دەکەین. رۆژنامەکان لە بابەتی هەمە چەشن پێك دێن و پەیامەکانیان بە شێوەی جۆراوجۆر پێشکەش دەکەن. ئەوان بە ناونیشانەکانیان دەتوانن بە شێوەی تامەزرۆیی و هەڵخەڵەتاندن دیدی خەڵك سەبارەت بە شتێك بگۆڕن. بڵاوکراوە بۆ ئەوەی فرۆشی زۆرتر بێت، بایەخ بە هەواڵی لەناکاو و گەورە و سەرنجڕاکێش دەدات. لە نوسینی وتاریشدا لەبەر ئەوەی زانیاریەکان بە کورتی ئاماژەی پێ دەدرێت و هەندێ جار وردەکاریی و شیکاریی چیرۆکەکەی تێدا نابێت، و راستیی بارودۆخێك یان گۆشەنیگایەك بە شێوەیەکی لایەنگیرانە پێشکەش دەکات. رۆژنامە گەورەکانی جیهان لە لایەن خاوەنەکانیانەوە بە تێڕوانین و بیروباوەڕی تایبەتی و بە ئامانجی دانانی جۆرێك لە رەفتاری چاوەڕوانکراو لە لایەن پێشکەش کاران بەرێوە دەبرێن.

# بابەتی سێیەم

## جۆرەکانی رۆژنامە

رۆژنامەکان لە گۆشەی جیاوازەوە دابەش دەکرێن، وەك چەشن یان جۆری هەواڵ، یان کاتی بڵاوکردنەوە، یان ئەو ژمارەیەی کە بڵاودەکرێتەوە وەکو رۆژنامەکانی رۆژانە و هەفتانە و مانگانە و وەرزیی و تایبەت و ناوچەیی و سەرانسەریی و نێودەوڵەتیی، یاخود ئەو رۆژنامانەی کە بە خۆڕایی دابەشدەکرێن. رۆژنامە خۆڕاییەکان تیراژێکی زۆریان هەیە و داهاتی خۆیان لە رێگەی ریکلام و ئاگاداریەکان و بەشێکی کەمیش لە رێگای هەواڵ بە دەست دەهێنن. رۆژنامە خۆڕاییەکان زیاتر بەیانیان دەردەچن و هەر کامێکیان خوێنەری تایبەت بە خۆیان هەیە. ئەو رۆژنامانەی کە وروژێنەرن لە جیاتی ئەوەی کە گرنگیی بە هەواڵی جدی بدەن، گرنگی بەو هەواڵانە دەدەن کە هەست و سۆزی خەڵك رادەکێشێت، خوێنەری جیاوازیان لەگەڵ رۆژنامەی وەرزی هەیە. رۆژنامە ناوچەیی و خۆڕاییەکان لە هەر دوو جۆری گەورە و بچوك بڵاو دەکرێنەوە، بەڵام زیاتر لە جۆری بچوکدا بڵاو دەکرێنەوە. رۆژنامە لۆکاڵیەکان بە مەبەستی راکێشانی خوێنەران، لەگەڵ رۆژنامە سەرانسەرییەکان کێبڕکێ دەکەن، هەر لەبەر ئەوەشە کە ناوەڕۆکێکی لۆکاڵی و سەرانسەرییان هەیە.

# بابەتی چوارەم

## میدیا بە چ شێوەیەك كاریگەریی لە سەر خەڵك دەبێت

میدیاكان تەكنیكی جۆراوجۆریان بۆ راكێشانی وەرگر هەیە و هەر بە هۆی ئەو تەكنیكانەشە توانیویانە سەرنجی زۆرترین وەرگر بۆ لای خۆیان رابكێشن. میدیاكان كاریگەرییان بۆ سەر خەڵك هەیە ودەتوانێت رۆڵێكی گرنگ بۆ بە كۆمەڵایەتیی بوونی منداڵان جێبهێڵێت. میدیاكان بە تایبەت تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت دەتوانن كاریگەریەكی قوڵیان لە سەر منداڵان هەبێت و دید و بۆچوونی ئەوان سەبارەت بەو شێوەیەی كە مەبەستیانە بیگۆڕێت، هەروەها خانەوادە و هاوڕێیان و قوتابخانە و هتد.. دەتوانن لەو بوارەدا رۆڵێكی گرنگ ئەدا بكەن. میدیاكان بە مەبەستی پتەوكردنی پەیوەندیەكان لەگەڵ تاكەكانی ناو كۆمەڵگا هاوكاری وەرگر دەكات. هەندێك جاریش كاتێك لەگەڵ یەكتر لەبارەی بابەتێكەوە بەشداری دەكەن ئەو دەرفەتە دەڕەخسێنێت كە كاریگەریی لەسەر یەكتر بنوێنین، بەڵام ئەو كاتەی كە خەڵك تەنها بەكارهێنەربن، پەیامەكانیان یەك لایەنە بە سەر وەرگر دەسەپێنێت. ئەگەر چی ئێمە دەتوانین ئەو پەیامانە هەڵبژێرین كە دەمانەوێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە شێوەیەكی هەڵخەڵەتاندن و لە رێگای جۆراوجۆرەوە كاریگەریی خۆیان لە سەر وەرگر بەجێ دەهێڵن.

# بابەتی پێنجەم

## هەواڵ چییە؟

هەواڵ بە واتای گەیاندنی زانیاری دێت، لەبارەی هەر شتێك كە ببێتە جێگای سەرنجی زۆری خەڵك و لە هەمان كاتیشدا پێویستە هەواڵ نوێ بێت. ئەگەر لەو پێناسەیە ورد بینەوە، جەخت لە سەر دوو خاڵ دەكاتەوە، یەكەمیان نوێ بوون و دووەمیشیان جێگای سەرنجی كۆمەڵگا بێت. هەندێكی دیكەش وێڕای جەختكردنەوە لە سەر بەهای هەواڵی، كە وەك ئەوەی جێگای سەرنجی خەڵك بێت، جارێكی دیكە هەواڵیان بە خەڵك پێناسەكردووە، بە واتایەكی دیكە كاتێك ئێمە لەبارەی هەواڵێكەوە قسە دەكەین، هێما بۆ ئەو رووداوانە دەكەین كە بۆ ئێمە گرنگ و جێگای بایەخە، وەكو رووداوەكانی رۆژ و دەستپێشخەرییە تازەكان و داهێنانەكان و بەرنامەكانی گەشەپێدان، یان ئەو بابەتانەی كەوا بڕیارە لە ئاییندەدا روو بدات، هەموویان دەتوانن هەواڵ بن. هەروەها هەواڵ دەكرێت لەبارەی رووداوەكانی جیهان یان ئەو وڵاتەوە بێت كە تێیدا دەژیت. هەواڵ لە لایەن رۆژنامەنووس لە سەر پێوەری بەهای هەواڵی دەست نیشان دەكرێت.

# بابەتی شەشەم

## بنەماکانی نوسینی هەواڵ

خەڵك بۆ وەرگرتنی هەواڵە نوێیەکانی ڕۆژ، متمانە بە ڕۆژنامەکان دەکات. هەر ئەو بابەتە بەرپرسیارییەتی ڕۆژنامەنووس بۆ دیاریکردنی ئەوەی کە لە راستیدا هەواڵ چییە زیاتر دەکات، لەبەر ئەو هۆیەشە لە بنەمای (دروستیی و ڕوونیی و کورتیی) پێك دێت. هەواڵ دەبێت جێگای سەرنجی خەڵك بێت و ئەگەر ڕۆژنامەنوسان راستیی و دروستیی هەواڵ، قوربانی سەرنج راکێشی بکات، بێگومان هەواڵەکەی بێ بەها دەکات. هەواڵی هەڵە متمانەی دەزگا راگەیاندنەکە کەم دەکاتەوە و، متمانەی وەرگرەکانی لە دەست دەدات، هەروەها مانەوەشی وەك ڕۆژنامەیەکی ئازاد روبەروی مەترسی دەکاتەوە. لە سەر ڕۆژنامەنووس پێویستە زانیاری دروست و دور لە لایەنگیری پێشکەش بە خەڵك بکات. پێدانی زانیاری راست و دروست لە لایەن میدیاکانەوە دەبێتە هۆی بە ئاگابوونی خەڵك لە چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان و لە هەڵبژاردنەکانیش رێنمایی دەنگدەر دەکات بۆ ئەوەی دەستنیشانکردنێکی زیرەکانە پێشکەش بکات. ڕۆژنامەنوسان لە کاتی نووسینی هەواڵدا پێویستە ڕەچاوی ناوەڕۆکی زانیارییەکان بکەن، لە روی گواستنەوەی داتا و ناوی کەسەکان و لێدوان و سەرچاوەکان. هەواڵ پێویستە سەرنج راکێش و زانیاری بەخش و هۆشیارکەرەوە بێت، لە پاڵ ئەمانەیشدا پێویستە دروست و ڕون بێت و خۆی لە نوسینی وشەی زیاد و دووبارە بپارێزێت.

# بابەتی حەوتەم

## بەهاکانی هەواڵ

سەبارەت بە بەهاکانی هەواڵ هەندێ جار پێناسەیەکی نائاسایی بۆ دەکرێت و دەگوترێت "هەواڵی باش هەواڵی خەراپ" لەبەرئەوەی خەڵك بایەخی زیاتر بە هەواڵی نەرێنی دەدەن، یان هەندێك جاریش دەگوترێت هەواڵی ئاسایی کەمتر خوێنەر بۆ لای خۆی رادەکێشێت، بۆ نمونە ئەگەر هەواڵێك بڵاوکرایەوە کە تێیدا هاتبوو، سەگێگ گازێکی لە مرۆڤێك گرتووە هەواڵ نییە، بەڵام ئەگەر مرۆڤێك گاز لە سەگێك بگرێت ئەوە پێی دەگوترێت هەواڵ، چونکە زانیاریەکە نائاساییە. رۆژنامەنوسان "سەرنجڕاکێشیی" وەك بەهایەکی هەواڵیی ناوزەد دەکەن، هەروەها ناوبانگیی و نزیکیی جوگرافیی و فەرهەنگیی و مەعنەویی و تازەیی و پەیوەنداری و ئەو هەواڵانەی کە دەبنە جێگای ئارەزووە مرۆییەکان، بە هۆی ئەوەوە دەبنە جێگای پیشوازیی وەرگرانی دەزگا راگەیاندنەکان و ناوەڕۆك و ئامانجی هەواڵەکە پربایەختر دەکەن.

# بابەتی هەشتەم

## بابەتیی و بێلایەنیی

رۆژنامەوان یان پەیامنێر بۆ گواستنەوەی زانیارییەکانی ناو هەواڵ بەر لە هەر شتێك پێویستە بیر لە گواستنەوەی راستییەکان بکاتەوە و لە کاتی ڕومالّکردنی هەواڵ ویژدانی خۆی ئاسودە بکات. رۆژنامەنوس لە کاتی ڕومالّکردنی زانیاری ناو رووداوەکان ئەگەر چی پێویستە کە ویژدانی حوکم بکات، بەلاّم هەندێ جاریش بە هۆی سیاسەتی دەزگاکەیان ناتوانن بێلایەنی تەواو بنوێنن، بەلاّم تا ئەو ئاستەی کە پێیان دەکرێت پێویستە رەچاوی ویژدان و بێلایەنیی بکەن. رۆژنامەنووسان لە کاتی پێشکەش کردنی زانیارییەکان و ئەو زمانەی کە بە کاری دەهێنن پێویستە کرۆکی بێلایەنی ڕەچاو بکەن، هەروەها تۆنی دەنگ و زمانی جەستەشیان لە کاتی پێشکەش کردنی زانیارییەکان پێویستە کە لایەنگری پێوە دیار نەبێت. متمانە و بڕوای پەیامنێر کاتێك لە لایەن وەرگرەوە بە هێند وەردەگیرێت کە لە گواستنەوەی زانیاری ناو رووداوەکان لایەنگیری تێدا نەکات و راستی و دروستی رووداوەکان وەك خۆی بگوازێتەوە، چونکە هەواڵی لایەنگیرانە و دوور لە راستیی متمانە و بیروباوەڕی وەرگر لاواز دەکات.

# بابەتی نۆیەم

## پاسەوانی دەرگا

ئەو هەواڵانەی کە لە ڕۆژنامەکان و رادیۆ و تەلەفزیۆنەکان بڵاو دەکرێتەوە و بە گوێی وەرگرانی دەگات، پێش بڵاوکردنەوەی بە تەتەڵە کردنی سەرنوسەردا تێپەر دەبێت و ئەگەر پێویست بکات، چاکسازیی پێویستی لەبارەیەوە ئەنجام دەدرێت، بەو هەنگاوە دەگوترێت کاری پاسەوانیی دەرگا. ئەو پرۆسەیە لە هەندێ شوێن دەبێتە هۆی پشتگوێ کردنی هەندێك لە هەواڵەکان بە هۆی بەگرنگ نەزانینیان لە لایەن سەرنوسەرەوە. هەروەها پەیامنێرانیش کاتی ئامادەکردنی هەواڵ ئەو ئەرکەیان لە سەر شانە، کە لە نێوان ئەو تێبینیانەی کە لە لای خۆیان لە سەر روداوێك تۆمار کردووە، زانیاری پێویستی بە شێوەیەکی کورت و رون لێ دەستنیشان بکەن و بە وەرگرانی ببەخشن. پاسەوانی دەرگا(دەرکەوان) هەروەها لەبارەی پایە و رێژەی گرنگیی هەواڵەکە بڕیار دەدات. ئەو هەنگاوە تەنانەت کاریگەریی لە سەر رێگاکان و نوسینی پەیامنێرانیش دەبێت. پەیامنێران لە کاتی ئامادەکردنی هەواڵ لە نێوان یاداشتەکانیان زانیاری پێویست بە شێوەیەکی کورت و رون دەردەهێنێت و ئەو یاداشتانە بە شێوەی هەواڵێك، کە جێگای رەزامەندی خەڵك بێت دەگوازێتەوە. هەروەها دەکرێت کە لەو هەنگاوەدا بەشێك لە زانیاریەکان لابدرێن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە رەچاوی گرنگترین زانیاری ناو چیرۆکی هەواڵەکە بکرێت.

# بابەتی دەیەم

## پەیکەری چیرۆکی هەواڵ

هەواڵ بەر لەوەی لە لایەن دەزگاکانی راگەیاندن بڵاو بکرێتەوە، پێویستە ئامادەکردنی بۆ بکرێت و رۆژنامەنوسان لە کاتی ڕوماڵکردنی زانیاری ناو روداوەکان شێوازی جیاواز بە خۆیان هەیە. یەکێك لە شێوازەکانی نوسینی هەواڵ، شێوازی هەرەمی هەڵگەڕاوەیە، لەو شێوازەدا گرنگترین بەشی لە لیدا (پەرەگرافی یەکەم) دادەنرێت دواترلە روی گرنگیەکەی بە شێوەیەکی قۆناغبەندی لە دوای یەکتر دادەنرێت و تا لە کۆتایی هەواڵەکە نزیك بیتەوە، گرنگیەکەی کەمتر دەبێتەوە و ئەوەی کە کەمتر جێگای بایەخە لە کۆتایی هەواڵ ئاماژەی پێدەدرێت. هاوکات شێوازێکی تری نوسینی هەواڵ چیرۆکی (داستان)ـــی دەنوسرێت. لە شێوازی چیرۆکیدا، نووسەر سود لە وشەی پێداهەڵگووتن وەردەگرێت بۆ گواستنەوەی زانیاری ناو روداوەکان، هەروەها لە شێوازی چیرۆکیدا گرنگی بە بەکارهێنانی چەمك وشە و زاراوەکان ونیشاندانی رەفتاری خەڵك لە ناو روداوەکە دەکرێت. هەروەها شێوازی سێیەم کاتژمێری لمیە، ئەو شێوازە لە هەر دوو شێوازی هەرەمی هەڵگەڕاوە و چیرۆکی پێك دێت.

# بابەتی یازدەیەم

## شێوازی هەرەمی هەڵگەڕاوە

لە شێوازی هەرەمی هەڵگەڕاوەدا گرنگترین زانیاریەکانی ناو هەواڵ لە سەرەوەی هەواڵ دا جێگیر دەبێت و تا بەرەو کۆتایی هەواڵەکە برۆین گرنگییەکەی کەمتر دەبێتەوە. ئەو شێوازە ناسراوترین شێوازی هەواڵی میدیاکانەو لە لایەن زۆربەی دەزگا راگەیاندنەکانەوە بۆ دارشتنی هەواڵ سودی لێوەردەگیرێت. پەرەگرافی یەکەم لە شێوازی هەرەمی هەڵگەڕاوە بە لید ناودەبرێت، لید بە واتای هەڵێنجراوی گرنگترین بەشی هەواڵ ناوزەد دەکرێت و لە یەك رستە تا دوو رستە پوخت دەبێتەوە. لە شێوازی هەرەمی هەڵگەڕاوە پەرەگرافەکانی دوای لید رۆڵی پارێزگاریکردن لە لیدیان دەبێت.

# بابەتی دوازدەیەم

## دەستپێکردنی نوسینی لید

لید یان پەرەگرافی دەستپێکی هەواڵ، پێویستە کورت و پوختکراو بێت، هەروەها دەبێت هەر لە سەرەتا دا بۆ راکێشانی وەرگر رۆڵی قولاب ئەدا بکات، بە شێوەیەك کە سەرنج راکێش بێت و وەرگر بە دوای خۆیدا تامەزرۆ بکات. نوسینی لیدێکی باش تا رادەیەك ئاسان نییە، بە جۆرێك کە بە بڕوای بەشێك لە مامۆستایانی زانکۆی بواری رۆژنامەنوسی، ئەگەر رۆژنامەنوس دەستپێکی دارشتنی هەواڵەکەی بە شێوەیەکی ئەکادیمی و لۆژیکی پەیڕەو بکات، دەتوانێت کۆتایی هەواڵەکەشی بە باشی تێپەر بکات و هەواڵێکی سەرکەوتوو بەرهەم بێنێت. هەر بەو هۆیەشەوەیە کە مامۆستایانی زانکۆی بواری رۆژنامەنوسی لەو بڕوایەدان کە نووسینی لیدێکی بەهێز و سەرنجراکێش و کاریگەر ئاسان نییە و پێویستە کە بنەماکانی نوسینی لید ڕەچاو بکرێت. رۆژنامەنوس پێویستە لە نوسینی لیددا وەڵامی هەر شەش پرسیارە سەرەکییەکە بداتەوە. بێگومان لید جۆری جیاوازی هەیە، لیدی نەرم و لیدی سەخت. سەبارەت بە بەکارهێنانی هەر یەکێك کە لە کوێ بەکاردێت، بە گرنگی و رەگەزەکەی پەیوەندار دەبێت. هاوکات لیدی سەخت بۆ هەواڵی خێرایە، لیدی نەرمیش بۆ ئەو هەواڵانەیە کە زۆر خێرا نین.

# بابەتی سێزدەیەم

## هەواڵی سەخت و هەواڵی نەرم

هەواڵی نەرم و هەواڵی سەخت دوو دەستەواژەن کە ئەمڕۆ بۆ دابەشکردنی هەواڵ بەکاردەهێندرێت و هەر کامێك بە پێی ماهیەت و رەگەزی هەواڵ لە لایەن رۆژنامەنوسانەوە بەکاردەهێنرێت. هەواڵی سەخت ئەو هەواڵانەن کە پێویستە بەخێرایی بڵاوبکرێنەوە و ئەگەر بە خێرایی بڵاونەکرێنەوە کۆن دەبن و گرنگی خۆیان لە دەست دەدەن، بە پێچەوانەوەش هەواڵی نەرم پێویستی بەوە نیە کە خێرا بڵاوبکرێنەوە و لە روی کاتی بڵاوکردنەوە خێرایی کەمتر لە خۆ دەگرن. هەواڵ لەبارەی کارەسات و جەنگ و تاوان و گۆڕانکاری گەورەی سیاسی بە هەواڵی سەخت هەژمار دەکرێت.

هەواڵی نەرم بەو هەواڵانە دەگوترێت کە ئانی نەبێت، بەڵکو وەکو پەروەردە یان سەرگەرمیی یان شێوەکانی ژیان کەسایەتییە دیارەکان لە خۆ بگرێت. هەروەها هەواڵی نەرم بە شێوازی چیرۆك دەنوسرێت، هەر بەو هۆیەشەوەیە لە شێوازەکانی چیرۆك و پێدا هەڵدان سوود وەردەگرێت، لە لایەکی دیکەوە هەواڵی سەخت فەرمیترە و لە رووی شێوازی رێکخستنەوە لە هەرەمی هەڵگەڕاوە نزیك دەبێتەوە.

# بابەتی چواردەیەم

## شێوازی کاتژمێری لمیی

شێوازی کاتژمێری لمی یەکێکە لە شێوازەکانی دروستکردنی هەواڵ، کە لە سێ بەش پێك دێت. لە بەشی یەکەمی هەواڵ بە شێوازی هەرەمی هەڵگەڕاوە و لیدێکی پوختکراو پێك دێت. لە بەشی کۆتایشیدا بەشێوەی ڕێکخراو و چیرۆکیی پێك دێت. ئاساییە کاتێك پەیامنێر دەیەوێت بەشی یەکەمی کاتژمێری لمی بە بەشی کۆتایی ببەستێتەوە، پێویستە لە یەك ڕستە یان پەرەگرافێك کە پێی دەوترێت ڕستە دانەر بە کاری بهێنێت. کاتژمێری لمی کە شێوازێکی هونەرمەندانە و هونەریە و زیاتر بۆ هەواڵی ڕوداوی کۆمەڵایەتی و وروژێنەر بەکاردێت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بۆ جۆرەکانی هەواڵ وەکو تاوانەکان و بازرگانی و هەواڵی پەیوەندار بە دەوڵەت و هەروەها وتاربێژی و گردبوونەوەکان سودی لێ وەردەگیرێت. لە شێوازی کاتژمێری لمی بۆ دورکەوتنەوە لە دووبارە کردنەوەی بابەتەکان لە بەشی پەیوەندار بە هەرەمی هەڵگەڕاوە تەنها چەند پەرەگرافێکی گرنگتر نەك تەواوی هەواڵ دەهێنرێت.

# بابەتی پازدەیەم

## چاوپێکەوتن

چاوپێکەوتن بە یەکێك لە رێگاکانی بەدەست هێنانی زانیاری هەژمار دەکرێت. چاوپێکەوتن ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕایە لە نێوان دوو کەس یان زیاتر. بێگومان چاوپێکەوتن بە باشترین رێگای بە دەست هێنانی زانیاری لە قەڵەم دەدرێت. هەروەها چاوپێکەوتن لە رێگای روبەڕوبونەوە یان لە رێگای پەیوەندی تەلەفۆنی یان نوسراو یان لە رێگای ئیمێلەوە دەتوانرێت ئەنجام بدرێت. شارەزایانی بواری رۆژنامەنوسیی، چاوپێکەوتن بەوە پێناسە دەکەن کە ئەنجامدانی ئاڵوگۆری زانیارییە لە رێگای پرسیار و وەڵام، لە نێوان رۆژنامەنوس و سەرچاوەی هەواڵ. رۆژنامەنوسان بە شێوازی ئەکادیمی و هۆشیارییەوە هەوڵ دەدەن، کە ئەو کەسەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجام دەدەن ناچاری بکەن کە قسەیان بۆ بکات و بە هۆیەوە زانیاری پێویستیان دەست بکەوێت. رۆژنامەنوسان ئەگەر نەتوانن لە کاتی دروستکردنی راپۆرتەکانیان پرسیاری دروست و پێویست بکەن، ئەوا ناتوانن بەرهەمێکی ئامانجداریان دەست بکەوێت. رۆژنامەنوس ئەگەر لە میانی چاوپێکەوتنەکەیان توانای هونەری نەبێت و شارەزای تەکنیکەکانی چاوپێکەوتن نەبێت، لەوانەیە بە هۆی پرسیاری توند هەر لە سەرەتاوە چاوپێکەوتنەکەی پەك بخات. تایبەتمەندیی رۆژنامەنوس بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەوتنێکی ئاسایی پێویستە توانای سەبر و ئارامی هەبێت و خاوەن متمانە بێت و لەکاتی وەڵامی بەرامبەرەکەی بێدەنگ بێت.

# بابەتی شازدەیەم

## دروستکردنی چاوپێکەوتن

چاوپێکەوتنەکان لە دوو جۆر پێك دێت کە بریتین لە هەڕەمی و هەڕەمی هەڵگەڕاوە. لە شێوازی هەڕەمدا پرسیاری ئاسان لە سەرەتادا دەکرێت و پرسیاری قورس و، هەموو ئەو پرسیارانەی کە لە چاوپێکەوتنەکە دەکرێت، نابێت ئەو کەسە هەراسان بکات کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجام دەدرێت، بەڵکو ئەو پرسیارانە بۆ کۆتایی چاوپێکەوتنەکە هەڵدەگیرێت. لە چاوپێکەوتن بە شێوازی هەڕەمی هەڵگەڕاوە سەرەتا پرسیاری قورس دەست پێدەکرێت و تا لە کۆتایی چاوپێکەوتنەکە نزیك بێتەوە دەگاتە پرسیاری سادە و ئاسان. لە شێوازی هەرەم چاوپێکەوتن بە پرسیارەکانی تایبەت بە پێشینەی کەسەکە دەست پێدەکات، یاخود بە واتایەکی دیکە بە پرسیاری کراوە دەست پێدەکات و بە پرسیاری داخراو کۆتایی پیێ دێت. ئەو شێوازە چاوپێکەوتنە بۆ ئەو کەسەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجام دەدرێت ئەگەر دور و درێژیش بن گرفتێك دروست ناکات و چاوپێکەوتنێکی سودبەخشی لێدەردەچێت.

# بابەتی حەڤدەیەم

## پرەنسیبەکانی ڕێنوێنیی چاوپێکەوتن

چاوپێکەوتن جۆری جیاوازی هەیە و هەر یەکێك لە جۆرەکانی چاوپێکەوتن مەرجی جیاواز بە سەر ڕۆژنامەنوساندا دەسەپێنن. چاوپێکەوتن بە شێوەی ڕووبەڕوو بە باشترین جۆری چاوپێکەوتن لە قەڵەم دەدرێت، بەڵام هەریەك لە جۆرەکانی دیکە لە جێگای خۆیان دەتوانن ڕۆڵێکی گونجاوتر ببینن. ڕۆژنامەنوسان بۆ ئەنجامدانی باشترین چاوپێکەوتن پێویستە چەند خاڵێك ڕەچاو بکەن:ـ

پێویستە بۆ پاڵەوانی چاوپێکەوتنەکە، پێش دەستپێکردنی چاوپێکەوتن پوختەیەك لە پرسیارەکانی بۆ باس بکرێت، هەڵبەتە پێویستیش نییە کە وردەکارییەکانی ناو پرسیارەکان ئاشکرا بکرێن. هەروەها پێویست دەکات لە سەر ڕۆژنامەنوس کە خۆی و ئەو دەزگایەیی کە تێیدا کار دەکات بەو کەسەی بناسێنێت کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجام دەدات و شوێن و کاتێکی گونجاو بۆ چاوپێکەوتنەکە دیاری بکات و روخۆش بێت بە پێی شوێن و ئەو کەسەی کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجام دەدات جلوبەرگی گونجاو بپۆشێت و لێکۆڵینەوەیەکی سەرەتایی سەبارەت بە تەوەری گفتگۆکەی هەبێت و شوناسێکیشی لە سەر سیڤی ئەو کەسە هەبێت کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجام دەدات، چونکە زانینی ئەو زانیارانە هاوکاری زیاتری ڕۆژنامەنووسەکە دەکات.

# بابەتی هەژدەیەم

## جۆرەکانی پرسیاری چاوپێکەوتن

هەر وەك چاوپێکەوتن جۆری جیاوازی هەیە، پرسیارەکانی چاوپێکەوتنیش لە روی دارِشتنەوە هەمەجۆرن بەم شێوەیە پۆلێن دەکرێن. پرسیاری سەخت، پرسیاری پشتیوانی، پرسیاری چەند رویی ( ئەم جۆرە پرسیارانە دوو پرسیار یان زیاتر لە دوو پرسیار لە خۆدەگرێت). بەڵام بە شێوەیەکی گشتی پرسیارەکان بۆ دوو جۆری داخراو و کراوە دابەش دەکرێت. پرسیارەکانی داخراو ئەو پرسیارانەن کە وەڵامی کورت لە خۆ دەگرن و ئەو کەسەی کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجام دەدرێت، بە گوتنی بەڵێ یان نەخێر یان وەڵامی کورت دەداتەوە. بۆ نمونە ئەگەر لە کەسێك بپرسن تەمەنت چەندساڵە؟ یان هاوسەرگیریتان کردووە؟ ئەو جۆرە پرسیارانە بە پرسیاری داخراو ناودەبرێن، بەڵام پرسیاری کراوە بەو پرسیارانە دەگوترێت کە بە وردی وەڵامی خۆی بداتەوە، بە واتایەکی دیکە ماوەی پێویست بەو کەسە دەدرێت کە بۆچونی خۆی بخاتەڕوو. بۆ نمونە ئەگەر لە پاڵەوانی چاوپێکەوتنەکە بپرسرێت، بۆچونتان سەبارەت بە یاسای تازەی چاپەمەنی چیە؟ لە وەڵامی پرسیارەکەدا، پاڵەوانی چاوپێکەوتنەکە، دەتوانێت دید و بۆچونی خۆی بە شێوەیەکی دور و درێژ بخاتەڕو.

# بابەتی نۆزدەیەم

## رێنمایی دانانی پرسیارەکان

رۆژنامەنوس لە کاتی چاوپێکەوتن پێویستە کەشوهەوایەکی گونجاو دابین بکات بۆ ئەو کەسەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجام دەدات، کاتی پێویست دابین بکات بۆ ئەوەی پاڵەوانی چاوپێکەوتنەکە بتوانێت لەبارەی پرسیارەکان بە شێوەیەکی لۆژیکیی و دروست وەڵام بداتەوە. هەروەها بۆ دانانی پرسیارەکان پێویستە چەند خاڵێکی دیکە ڕەچاو بکرێت لە سەر رۆژنامەنوس پێویستە لە ناو یەك پرسیاردا چەند پرسیارێکی دیکە بە شێوەیەکی هاوکات ئاراستە نەکات، چونکە لەوانەیە پاڵەوانی چاوپێکەوتنەکە بەرسڤی تەواوی پرسیارەکان نەداتەوە و بە ئارەزوی خۆی هەندێك پرسیار وەڵام بداتەوە. هەروەها رۆژنامەنوس نابێت پرسیاری لە شێوەی لێپرسینەوە لە پاڵەوانی چاوپێکەوتنەکە بکات و روبەڕوی پرسیاری وروژێنەری بکات، چونکە دانانی ئەو جۆرە پرسیارانە دەبێتە هۆی نیگەرانیی پاڵەوانی چاوپێکەوتنەکە و توشی کاردانەوەی دەکات، بۆیە پێویستە کە هەوڵ بدرێت کاتی دانانی پرسیارەکان لەو دەستەواژانەی کە واتای لێپرسینەوە لە خۆ دەگرن، رۆژنامەنوس خۆی لێ بپارێزێت.

# بابەتی بیستەم

## کردەنیی و نەکردەنیەکانی چاوپێکەوتن

بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەوتن پێویستە هەوڵ بدرێت کە چاوپێکەوتنەکان بەو شێوەیە تۆمار بکرێت کە پاڵەوانی چاوپێکەوتنەکە، ئاخاوتنەکانی خۆی ڕەتنەکاتەوە. ئەگەر ئەو کەسەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجام دەدرێت داوای کرد کە بەشێك لە قسەکانی بڵاو نەکەنەوە، پێویستە لە سەر ڕۆژنامەنوس داواکەی جێبەجێ بکات. ڕۆژنامەنوس پێویستە لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ پاڵەوانی چاوپێکەوتنەکە بەڕێز بێت و هەوڵی دروستکردنی پەیوندی تۆکمە بدات لەگەڵی بۆ ئەوەی هەر کاتێك پێویستی بە ئەنجامدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو کەسە هەبوو، بەرامبەرەکەی کارئاسانیی بۆ بکات. ڕۆژنامەنووس پێویستە چاوپێکەوتنەکەی بە پرسیاری سادە دەست پێ بکات و پرسیارە سەختەکان بۆ کۆتایی چاوپێکەوتنەکە هەڵبگرێت و ئەگەر هەستیشی بەوە کرد کە پرسیارێك پاڵەوانی چاوپێکەوتنەکەی تووڕە کردووە، ڕۆژنامەنوسەکە پێویستە بۆ ماوەیەکی کاتیی وەڵامی پرسیارەکە فەرامۆش بکات و لە ناوەڕاستی چەند پرسیارێکی دیکەی چاوپێکەوتنەکەدا دوبارەیان بکاتەوە. پێتڤیە ڕۆژنامەنوس کەمتر قسە بکات و زیاتر بایەخ بە قسە و جوڵەکانی پاڵەوانی چاوپێکەوتنەکە بدات. خاڵێکی دیکە کە پێویستە ڕۆژنامەنوس ڕەچاوی بکات لەگەڵ پاڵەوانی چاوپێکەوتنەکە نەرمیی بنوێنێت و خۆی لە ڕووبەڕو بوونەوە بپارێزێت، بەمەش ڕۆژنامەنوس دەتوانێت زانیاریی زیاتر لە پاڵەوانی چاوپێکەوتنەکە وەربگرێت.

# بابەتی بیست و یەکەم

## پێناسەی فیچەر

فیچەر پارچە نوسینێکی رۆژنامەوانییە کە پرسێك یان بابەتێکی هەڵبژێردراو بە شێوەیەکی تێروتەسەل رووماڵ دەکات. فیچەر بە واتای بەشێك لە شتێك دێت، بەڵام لە رۆژنامەوانیدا فیچەر بە نوسراوێك دەگوترێت کە لەگەڵ هەواڵ نێوانی هەیە. لەو بابەتەدا زۆرترین باس شەنوکەو دەکرێت کە وتاری فیچەرییە و بە وتاری ناهەواڵیش ناودەبرێت. ئەو وتارانەی کە بە تەواوی هەواڵیە، بە هەواڵی خێرا و جددی وەکو هەواڵی پۆلیس، دادگاکان و بابەتی وەرزشی بایەخ دەدات، وەك هەواڵی سەخت سودی لێ وەردەگیرێت و ئەو جۆرە هەواڵانە پشت بە روداوە گەرم و خێراکان دەبەستێت. فیچەر زیاتر بایەخ بە ژیانی پشت پەردەی خەڵکی دیار دەدات، فیچەر لە هەواڵی سەختەوە دوورە. لەو وتارانەی کە فیچەرین، زانیارییەکانی داهێنەرانە و هزرییە و سەرەڕای ئەوەی کە زانیاری دەگەیەنێت، بۆ کات بەسەربردنیش بەکار دێت.

# بابەتی بیست و دووەم

## فیچەری هەواڵیی

لێرەدا فیچەری هەواڵیی وەکو سۆفت نیوز دانراوە، بە مانای هەواڵێك کە سەرەڕای ئەوەی کە گرنگیی بە خێرایی لە بڵاوکردنەوە نادات، لە هەمان کاتیشدا گرنگیی بە کاتی بڵاوکردنەوەی خۆی دەدات. فیچەری هەواڵیی بە بەراورد لەگەڵ هەواڵە سەختەکان دوورودرێژترن، هەر ئەو هۆیەشە، کە دەتوانێت بابەتگەلێك لە خۆ بگرێت. فیچەرەکان بابەتی سەرنجراکێشە مرۆییەکان لەخۆدەگرن و بە وشەی پێداهەڵدان و ڕەنگ و جوڵە بایەخ دەدات و دەتوانێت ڕۆڵی نووسەر لە کاتی نوسینی فیچەر بۆ چیرۆکنوسێك بگۆرێت. فیچەرێکی باش لە چاوپێکەوتن و زانیاری پێك هاتووە و بە ڕووداوێکی ڕۆژ سەرقاڵ دەبێت و وەرگرانی لە ڕاستییەکان ئاگاداردەکاتەوە و ڕەنگرێژی بڕیاردانی وەرگر دەکات لە ژیانی ئیستا و ڕۆژانی داهاتوودا.

# بابەتی بیست و سێیەم

## راپۆرت چۆن دەنوسرێت؟

راپۆرت لەبارەی بابەت و پرسی تایبەت بە کۆمەلگا دەنوسرێت رۆژنامەنوسان هەولّ دەدەن کە لە گۆشەنیگای جیاوازەوە بابەتەکان تاوتویّ بکەن و دیدوبۆچوونە جیاوازەکان سەبارەت بە رووداوەکان شەنوکەو بکەن، و بۆ مەبەستی تێگەیشتن و زانیاری زیاتر هاوکاری وەرگر بکەن. رۆژنامەنووسان بۆ ئامادەکردنی راپۆرت سەرەتا زانیاری و پێشنیارەکان کۆدەکەنەوە و دواتر بە شێوازێکی چیرۆکی دارِشتنی بۆ ئەنجام دەدەن. رۆژنامەنووس پێویستە بۆ ئامادە کردنی راپۆرتەکەی، کرِۆکی راپۆرتەکەی دەستنیشان بکات، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو خالّە، راپۆرتەکەی ئامادە بکات. رۆژنامەنووس پێش ئەوەی راپۆرتەکەی ئامادە بکات پێویستە لە خۆی پرسیار بکات کە بۆچی ئەو راپۆرتە دەنوسێت؟ و یان لە خۆی پرسیار بکات، ئاخۆ ئەو کەسانەی بابەتەکەی دەخوێننەوە چییان لێی دەست دەکەوێت؟ رۆژنامەنووس لە رێگای پرسیار و وەلاّمەکانی، دەتوانێت راپۆرتێکی باش بەرهەم بهێنێت. دەستنیشان نەکردنی ئامانجی راپۆرت دەبێتە هۆکاری راپۆرتێکی بیّ ئەنجام و وەرگر لە بەهای راپۆرتەکە دوور دەخاتەوە.

# بابەتی بیست و چوارەم

## ڕێنمایی زیاتر بۆ پەیامنێران

پەیامنێریی کارێکی چەند لایەنەیە، پەیامنێر پێویستە ئامانجی خۆی دیاری بکات و هەوڵی کۆکردنەوەی زانیاری بدات و لەگەڵ ژینگەی دەوروبەری خۆی بگونجێنێت، بە واتایەکی تر لەگەڵ خەڵکی کۆڵان و بازار گفتوگۆ بکات و لە گیرو گرفتەکانیان بکۆڵێتەوە و گرفتەکانیان لە ڕێگای راپۆرتێك روبەروی بەرپرسان بکاتەوە. پەیامنێر بۆ دۆزینەوەی ئامانجەکانی پێویستە بچێتە ناو خەڵك و هەوڵی بە دەست هێنانی زانیاری بدات لەبارەی ئەوەی لە دەوروبەری ڕوودەدات. پەیامنێر پێویستە لە شوێنە قەرەباڵغەکان وەکو نۆرەی پاس و لە نێو دۆستان و خزمان، چاو و گوێی خۆی سەبارەت بە گرفتەکان بکاتەوە و بۆ ئەو گرفتانە هاوسۆزیی نیشان بدات. هاوکات پەیامنێر پێویستە هەوڵی بەهێزکردنی پەیوەندییە گشتییەکانی بدات و پەیوەندییەکانی لەگەڵ گشت چین و توێژەکان پتەو بکات. پەیامنێران پێویستییان بە لیستێك لە ناو و پێگەی کەسایەتییە دیار و بەرپرسەکان و ئەو کەسانە هەیە کە چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ئەنجام دەدەن. پەیامنێری پیشەیی پێویستە ئەرشیفێکی تایبەت بە خۆی هەبێت، تا لە کاتی پێویستدا بتوانێت سوودی لێوەر بگرێت.

# بابەتی بیست و پێنجەم

## پرۆسەی نووسین

ئێوە ئەگەر بتانەوێت ببنە نووسەر، دەبێ بنووسن، پرۆسەی نووسین بە نووسینی بەردەوام بەهێز دەبێت، ئەو پرۆسەیە لە چەند قۆناغ پێك دێت. کۆکردنەوەی بابەتەکان، هەڵوەستەکردن لەسەر بابەتەکە، رێکخستن و نووسین و خوێندنەوەی دووبارە. ئەگەر نەتوانن زانیاری باش دەستەبەر بکەن، نوسینەکەتان بەپێز نابێت. نووسەر پێویستە وێنەیەکی روونی لە سەر ناوەڕۆکی بابەتەکە هەبێت و بزانێت کە گرنگترین زانیاریەکان، یان بە واتایەکی دیکە بزانێت کامە خاڵە جەوهەری و زێڕینەکانی بابەتەکەیە. نووسەر بۆ ئەوەی زانیارییەکان شوێن بزر نەکات، پێویستە زانیارییە زیادەکان بناسێنێت و لێیان دوور بکەوێتەوە. نووسەر پێش ئەوەی کە دەست بە رێکخستنی نووسینەکەی بکات، پێویستە بیرۆکەیەك لە ناخیدا گەڵاڵە بکات. پیشەگەرانە نووسینێکی باش بەرهەم بهێنێت، نووسینێك کە جگە لەوەی پڕ لە زانیاری بێت هانی خوێنەر بدات بە دواداچوونی بۆ بکات.

# بابەتی بیست و شەشەم

## پەیامنێریی

پەیامنێری بۆ دەستەبەر کردنی زانیارییەکان پێویستە گەڕان و خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە لە کتێبخانە و ئینتەرنێت و گفتگۆ لەگەڵ کەسانی تایبەتمەند ئەنجام بدات. کاری پەیامنێریی زیاتر بریتییە لە ئەنجامدانی دیدار و چاوپێکەوتن لەگەڵ خەڵکێك کە زانیاریان لە سەر چیرۆکەکە هەبێت یان بەشێك بن لە چیرۆکی ڕووداوەکە. هەر دوو جۆری ئەم خەڵکەش پێیان دەگوترێت سەرچاوەی هەواڵ. پەیامنێریی یەکێکە لە گرنگترین کاری رۆژنامەگەریی و یەکێکە لە گرنگترین رەگەزەکانی ئامادەکردنی راپۆرت. پەیامنێر زانیاری سەرنجڕاکێش و هەندێ جار دەستی یەکەم بە رۆژنامە نوسان دەدەن. پەیامنێریی بە تەواوی هونەرییە و پەیامنێر لە میانەی ئامادە کردنی لەگەڵ خەڵك بە گفتوگۆ هەڵدەستن و بابەتی فێر کردن و سەرسوڕهێنەر و چاوەڕواننەکراو، بە دەست دەهێنێت. هەر بەو هۆیەشە ئەو پیشەیە لەگەڵ جۆرەکانی دیکەی نوسین جیاوازە. پەیامنێران لە گواستنەوەی خاڵی بۆچونی خەڵکی تر پێویستە چاودێری بابەتە یاساییەکان بکەن تا روبەروی کێشەکانی دادگا نەبنەوە.

**Please answer the following Questions briefly.**

1. What does reporting often involve?

Reporting often involves research-going to libraries, reading about an idea, thinking about where to get more information and who to talk to (all things that Internet can help with).

2. What is the heart of a news story?

Reporting is at the heart of a news story

(٢٦)

**تكايە بە كورتی وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەرەوە.**

**پ١/ئەركی پەیامنێر چیە؟**

**وەڵام/ ئەركی پەیامنێر بریتییە لە گەڕان لە كتێبخانەكان و خوێندنەوەی سەرچاوەكان بۆ دۆزینەوەی بابەتێك و بیر لەوە بكاتەوە كە لە كوێ زۆرترین زانیاری دەست دەكەوێت و كێ بدوێنێت.(ئینتەرنێت یارمەتیدەرێكی گرنگ دەبێت لەم رووەوە)**

**پ٢/ دڵی چیرۆكی هەواڵێك چیە؟**

**وەڵام/ پەیامنێریی بریتییە لە دڵی چیرۆكی هەواڵ.**

# Subject (26)

## Reporting

Reporting often involves research-going to libraries, reading about an idea, thinking about where to get more information and who to talk to (all things that Internet can help with). Most of all, reporting involves meeting and interviewing people who either know about the story or who are part of it. Those people are called sources.

Reporting is at the heart of a news story. Interviewing real people provides the meat of good story-quotes of what they said. Talking to people often leads to unexpected information that can take a story in a whole different direction. And people often tell wonderful stories, called anecdotes, to illustrate what they are talking about.

It is reporting that makes a news story so different from other forms of writing. And it is meeting people and learning surprising, unexpected- and sometimes amazing-things that make reporting so rewarding. And any of those ingredients will make your news story interesting.

A cautionary note on reporters and their sources is in order first. Reporters must always identify who they are and the fact that you are a reporter before beginning an interview. And if you want to interview someone or use what they have said in a story, you must ask permission and inform the source that you would like to publish that information or quotes. This is more than just courtesy and good ethical practice.

| | | | |
|---|---|---|---|
| Rewarding | پاداشتکردن | involves | تێوەگلان |
| Ingredients | پێکهاتەکان | libraries | کتێبخانەکان |
| Cautionary | وریاکەرەوە | information | زانیاری |
| Note | تێبینی | meeting unexpected | دیداری چاوەروانەنەکراو |
| Permission | روخسەت، مۆلەت | direction | ئاراستە |
| Inform | زانیاری دان | wonderful | جوان |
| Publish | بلاّوکردنەوە | anecdotes | گێرانەوە |
| Quotes | وەردەگرێت | illustrate | روونکردنەوە |
| Courtesy | رێز | surprising | کتوپر، لەناکاو |
| Ethical | ئەخلاقی | amazing | سەرسورهێنەر، سەرنجراکێش |

**Please answer the following Questions briefly.**

1. What does a successful writer usually do?

The successful writer usually gathers focuses, orders, drafts and revises.

2. How can a writer find a focus?

A writer can find a focus asking himself, what's the point? Imagine that you had to write a six-word headline for the story.

(٢٥)

**تكایه به كورتی وه‌ڵامی ئه‌م پرسیارانه‌ی خواره‌وه بده‌ره‌وه.**

پ١/ئه‌ركه‌كانی نوسه‌ری سه‌ركه‌وتوو چییه؟

وه‌ڵام/ بریتیه له دارشتنی بیرۆكه و ریزبه‌ندیی رووداوه‌كان و ره‌شنوس و پێداچوونه‌وه‌یان.

پ٢/ نوسه‌ر چۆن ده‌توانێت كرۆكی بیرۆكه‌یه‌ك بدۆزێته‌وه؟

وه‌ڵام/ نوسه‌ر ده‌توانێت به پرسیار له‌خۆ كردن مه‌به‌ستی بیرۆكه‌كه‌ی بخاته‌ڕوو كه له شه‌ش وشه‌دا سه‌ردێرێك دروست بكات كه گوزارشت له چیرۆكه‌كه بكات.

## Subject (25)

### The writing process

Writing is a process, a logical sequence of steps. You follow a pattern in getting dressed each day, in baking a cake or in changing a flat tire. In the same way, your writing should be the product of a logical process. The successful writer gathers focuses, orders, drafts and revises.

1. The first step in the process is gathering. good writing begins with good reporting. The writer must find the details that reveal meaning. You can't write writing; you have to have fact.

2. Once you have the facts, decide on a focus or theme. Each news story should have one dominant idea. That is the focus or reason for writing the story. Without a focus, stories wander and confuse the reader. To find the focus, ask yourself, what's the point? Imagine that you had to write a six-word headline for the story.

What one sentence tells the meaning of the story?

3. Next, decide which of your facts are most important and place them in a logical order. Discard all facts that don't flow from your focus statement. Like a blueprint, each story needs a plan. Each point should grow from the previous point and lead to the next one. Poor organization loses more readers than anything else. For the reader, the easiest thing is to stop reading.

4. Write quickly from beginning to end so that you can spend time with the middle of your story and with the ending. After you have written, edit your story to make it more powerful.

| | | | |
|---|---|---|---|
| writing | پێش نوسین | process | پرۆسە |
| Reveal | دەرخستن ، کەشف | logical | لۆژیکی |
| Dominant | کۆنترۆڵکردن | sequence | بەدوای یەکداهاتن |
| Reason | هۆ | pattern | نمونە |
| Without | بەبێ | dressed | جل لەبەرکردن |
| Wander | پیاسە کردن | baking | نانکردن |
| Confuse | سەرلێشێواو | product | بەرهەم |
| Sentence | رستە | successful | سەرکەوتوو |
| Discard | فرێدان | focuses | جەخت دەکاتەوە |
| Statement | بەیانکردن ، راگەیاندن | orders | فرمانەکان |
| Blueprint | پلان دانان | drafts | رەشنووس |
| Previous | پێشوو | revises | پێداچوونەوە |

**Please answer the following Questions briefly.**

1. How can we begin news gathering?

We can begin news gathering by keeping our eyes and ears open.

2. How can we begin to find story ideas?

We can begin to find story ideas by getting story ideas from other newspapers and magazines.

**(٢٤)**

**تكایه به كورتی وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەرەوە.**

**پ١/چۆن دەتوانین دەست بە كۆكردنەوەی هەواڵ بكەین؟**

**وەڵام/ لە ڕێگای هەمیشە كراوەیی چاوەكان و گوێیەكانمان دەتوانین دەست بە كۆكردنەوەی هەواڵ بكەین.**

**پ٢/چۆن دەتوانین بیرۆكەی چیرۆكێك دەست پێ بكەین؟**

**وەڵام/ بە وەرگرتنی بیرۆكەكان لە ڕۆژنامە و گۆڤارەكانیتر دەتوانین بیرۆكەی چیرۆكێك دەست پێ بكەین.**

## Subject (24)

### Further tips for reporters

Finding story ideas

*Keep your eyes and ears open; listen to what your friends are talking about.

*Read everything you can get your hands on; get story ideas from other newspapers and magazines.

*Research a subject that interests you ask yourself what you would like to know more about.

*Talk to people in a specific field to find out what is important to them.

Newsgathering

*Begin collecting articles on your subject.

*Talk to friends and associates about the subject.

*Contact any agencies or associations with interest or professional knowledge in the area.

*Create a list of people you want to interview; cover both sides of the story by interviewing people on both sides of the issue.

*Collect government statistics and reports on the subject get old press releases or reports to use as background.

| | | | |
|---|---|---|---|
| Articles | وتارەکان | finding | دۆزینەوە |
| Associates | ڕێکخراوەکان، پەیوەندار | newspapers | ڕۆژنامە |
| Contact | پەیوەندی | magazines | گۆڤارەکان |
| Agencies | ئاژانسەکان | subject | بابەت |
| Professional | پیشەیی | interests | بەرژەوەندی |
| Area | ڕووبەر | specific | دیاریکراو |
| Create | خوڵقاندن | field | بوار |
| Cover | دەپۆشێ | newsgathering | هەواڵ کۆکردنەوە |
| Statistics | ئامار | collecting | کۆکردنەوە |
| Releases | بڵاوکردنەوە | | |

**Please answer the following Questions briefly.**

1. What is the role of reporter?

The role of a reporter is to find out what people are thinking of an issue and to report the opinions of different stakeholders of an issue

2. How can a reporter bring the story to life?

A reporter can bring the story to life by providing some visual details .

(٢٣)

تکایە بە کورتی وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەرەوە.

پ١/رۆڵی پەیامنێر چیە؟

وەڵام/ بریتیە لەوەی کە، ئەوە بدۆزێتەوە کە خەڵك چۆن بیر لە پرسێك دەکەنەوە و ریپۆرتێك ئامادە بکات لەسەر بیروڕای پشکدارە جیاجیاکان لە سەر پرسێك.

پ٢/چۆن پەیامنێر دەتوانێت چیرۆکێکی کاریگەر و زیندوو بخاتەڕوو؟

وەڵام/ لە رێگای خستنەرووی هەندێك وردەکاری بینراو دەتوانێت چیرۆکێکی زیندو و کاریگەر بخاتەڕوو.

## Subject (23)

## What makes a report?

The role of a reporter is to find out what people are thinking of an issue and to report the opinions of different stakeholders of an issue. These comments make up the bulk of the story. The narrative helps to weave the comments into a coherent whole.

As a reporter, you are the eyes and ears for the readers. You should try to provide some visual details to bring the story to life (this is difficult if you have conducted only phone interviews, which is why face-to-face is best). You should also try to get a feel for the story. Having a feel means getting some understanding of the emotional background of the piece and the people involved in it. Try to get a sense of the characters involved and why they feel the way they do.

Hint: stick to one particular theme throughout the story. You can put in different details but they all have to relate to the original idea of the piece. (e.g. If your story is about black youth and their relationship with the police you Do NOT want to go into details about the life of any one particular youth).

The why question

Why am I writing this report? –what am I trying to achieve

Why am I writing this report? –what do I want my under to think and do after reading my report?

| | | | |
|---|---|---|---|
| Conducted | ئەنجامدان | role | ڕۆڵ |
| different | جیاوازە | Understand | تێگەیشتن |
| stakeholders | پشکداران | Emotional | سۆزاوی |
| comments | لێدوان | Involved | تێوەگلاو |
| bulk | قەبارە | Stick | پابەندبوون |
| weave | چنین | Particular | بە تایبەت |
| coherent | بە یەکەوە بەستراو | Throughout | بەدرێژایی |
| whole | هەموو | Original | ئەسڵی |
| provide | پێدان | Relationship | پەیوەندی |
| visual | بینراو | Achieve | بە دەست هێنان |
| details | وردەکاری | | |

**Please answer the following Questions briefly.**

1. According to the text what is balance?

Balance is presenting the opinions of people on both sides of an issue and let the readers make their own decision on who to believe

2. Which of the news feature or hard news are less time-sensitive?

News features are less time-sensitive.

**(٢٢)**

**تكايه به كورتى وه‌لامى ئه‌م پرسيارانه‌ى خواره‌وه بده‌ره‌وه.**

**پ١/ به پێى تێكسته‌كه ماناى هاوسه‌نگيى چيه؟**

**وه‌لام/ هاوسه‌نگى بريتيه له خستنه‌رووى بيروڕاى خه‌ڵك له هه‌ر دوو ديوى بابه‌تێك يان پرسێك و رێگاش به خوێنه‌ران بدرێت بڕيارى خۆيان ده‌رببڕن كه بڕوا به كامه لايه‌يان بكه‌ن.**

**پ٢/فيچه‌رى هه‌واڵ و هه‌واڵى سه‌خت كامه‌يان هه‌ستيارى كاتى كه‌متره؟**

**وه‌لام/ فيچه‌ره‌كانى هه‌واڵ هه‌ستيارى كاتيان كه‌متره.**

# Subject (22)

## News feature

A news feature takes one step back from the headline. It explores an issue. News features are less time-sensitive than hard news but no less newsworthy. They can be an effective way to write about complex issues too large for the terse style of a hard news item. Street kids are a perfect example. The stories of their individual lives are full of complexities which can be reflected in a longer piece.

Features are journalism's shopping center. They're full of interesting people, ideas, color, lights, action and energy, Storytelling at its height! A good feature is about the people in your community and their struggles, victories and defeats. A feature takes a certain angle and explores it by interviewing the people involved and drawing conclusions from that information. The writer takes an important issue of the day and explains it to the reader through comments from people involved in the story.

Hint: Remember to balance your story. Present the opinions of people on both sides of an issue and let the readers make their own decision on who to believe. No personal opinions are allowed. The quotes from the people you interview make up the story. You are the narrator.

| | | | |
|---|---|---|---|
| Energy | وزە | headlines | سەردێر |
| Community | کۆمەڵگای خۆجێیی | explores | دۆزینەوە |
| Struggles | خەبات، ململانێ | news features | فیچەرەکانی هەواڵ |
| Victories | سەرکەوتن | hard News | هەواڵی گەرم |
| Defeats | دۆڕاندن | newsworthy | بەهای هەواڵ |
| Angle | فریشتە | terse | کورت |
| Drawing | وێنەکێشان | individual | تاکەکەسیی |
| Conclusions | دەرئەنجام | complexities | ئاڵۆزیەکان |
| Balance | هاوسەنگی | reflected | رەنگدانەوە |
| Decision | بڕیار | piece | پارچە |
| Quotes | وەردەگرێت | center | ناوەند |
| Narrator | چیرۆك گێرەوە | action | کار |

**Please answer the following Questions briefly.**

1. What hard news topics are usually about?

Hard news topics are usually about approaches-police and courts, sports, local government, or business-written.

2. According to the text what is a feature?

A feature story is a special human interest story or article that is not closely tied to a recent news event.

(٢١)

تکایه به کورتی وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەرەوە.

پ١/ هەواڵی سەخت چ جۆرە بابەتێك لەخۆ دەگرێت؟

وەڵام/ هەواڵی سەخت بابەتی پۆلیس و دادگا و وەرزش و حکومەت و ئابوری لەخۆ دەگرێت.

پ٢/ به پێی دەقی بابەتەکە فیچەر چیه؟

وەڵام/ فیچەر بریتیه له بەشێکی تایبەتی ناهەواڵی، که له رۆژنامه و گۆڤارەکان بڵاو دەکرێتەوە.

# Subject (21)

## Defining feature writing

If you want to write, write. That's the advice of one of the ancient Greeks, If you want to be a good magazine or newspaper feature writer, first read this book.

If you take term literally, a feature is a special part of something. Feature articles are often special portions of the periodicals that publish them. They do take many different approaches and forms, of course. Most persons familiar with nonfiction writing for the news media think of the conventional straight news or hard news topics and approaches-police and courts, sports, local government, or business-written to give the who, what, when, where, why, and how. These stories emphasize the important persons, the activities, current events, local and regional orientation, explanation of importance, and nature of the event.

Feature stories go beyond this level to be special. Feature stories go beyond this level to be special. Feature writers often employ some license or flexibility and emphasize the unconventional or the different.

One professional writer defines feature writing as creative, subjective article writing that is designed to inform and entertain readers. Daniel Williamson's (1975) interpretation emphasized the four words that have been italicized. These points help to show features are different from straight news or information writing.

| | | | |
|---|---|---|---|
| Employ | فەرمانبەری | literally | بابەتیانە |
| Flexibility | سانایی | feature | فیچەر |
| Emphasize | جەختدەکاتەوە | periodicals | وەرزیەکان |
| Unconventional | ناباو | conventional | لاسایی کردنەوە |
| Professional | پیشەیی | courts | دادگاکان |
| Defines | پێناسە دەکات | business | کار |
| Creative | داهێنەر | activities | چالاکیەکان |
| Subjective | بابەتی | Designed | نەخشە کێشان |
| current | هەنوکەیی | Inform | زانیاری دەدات |
| regional | هەرێمی | Interpretation | وەرگێران |
| orientation | ئاراستەکردن | Italicized | خوار نووسین |
| explanation | شیکردنەوە | | |

**Please answer the following Questions briefly.**

1. Why we should tape an interview?

We should tape an interview because if anyone comes back at you, you have the proof of what was said

2.We should start an interview with <u>easy</u> questions; end with <u>difficult</u> questions.

**(٢٠)**

**تكایە بە كورتی وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەرەوە.**

**پ١/بۆچی پێویستە چاوپێكەوتن تۆمار بكرێت؟**

**وەڵام/ پێویستە چاوپێكەوتن تۆمار بكەین بۆ ئەوەی ئەگەر كەسێك گەرایەوە لات، بۆی بسەلمێنی كە چی گوتوە.**

**پێویستە ئێمە چاوپێكەوتن بە پرسیارە ئاسانەكان دەست پێ بكەین و بە پرسیارە زەحمەتەكان كۆتایی پێ بێنین.**

# Subject (20)

## Interviewing do's and don'ts

*Be polite.

*Explain the ground rules of the interview to people unfamiliar with how the media works-this means that you tell them the information they give you can and will be published. If they do not want any part of what they say published, they need to tell you it is off the record.

*Tape the interview (so if anyone comes back at you, you have the proof of what was said).

*Build a relationship with the person being interviewed.

*Start with easy questions; end with difficult questions.

*Read the body language of the person you're interviewing and if they get defensive, back away from the question you are asking and return later.

*Don't attack the source.

*Keep control of the interview; don't let the subject ramble or stray from the subject.

* On the other hand, don't let your opinion of what the story should be color the interview. Always remember that the person you are talking with knows more about the subject than you do.

| | | | |
|---|---|---|---|
| Attack | هێرش | polite | بەڕێز |
| Ramble | بێزارکەر | unfamiliar | ناباوە، رانەهاتوو |
| Stray | دوور کەوتنەوە | published | بڵاوکراوە |
| Opinion | ڕاوبۆچوون | proof | بەڵگە |
| Language | زمان | relationship | پەیوەندی |
| Person | کەس | difficult | زەحمەت |
| Build | دروست دەکات | body language | زمانی جەستە |
| Remember | بیرهێنانەوە | defensive | بەرگری کاری |
| Source | سەرچاوە | return | گەڕانەوە |

**Please answer the following Questions briefly.**

1. Why should we use a pause after asking questions?

We should use a pause after asking questions to give the person sufficient time to respond.

2. Why we should not ask multiple questions when we interview someone?

We should not ask multiple questions when we interview someone because we confuse the person.

(١٩)

**تکایە بە کورتی وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەرەوە.**

**پ١/بۆچی پێویستە لە دوای پرسیار کردن وەستان بەکاربێنین؟**

**وەڵام/ پێویستە دوای پرسیار کردن وەستانێك هەبێت بۆ ئەوەی بوار بدرێت کە کەسەکە کاتی هەبێت، وەڵام بداتەوە.**

**پ٢/بۆچی نابێت لە کاتی چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسێك پرسیاری هەمە جۆر بکەین؟**

**وەڵام/ لە کاتی چاوپێکەوتن نابێ پرسیاری هەمە چەشن بەکار بێنین چونکە کەسەکە تووشی سەرلێشێوان دەکەین.**

